# باویلکه

چەپکێك شیعر بۆ منالآن

**جەبار سابیر**

چاپی یەکەم

سلێمانی

پاییزی دوو هەزارو شەش

## باویلکه

شیعری منالآن

نوسەر: جەبار سابیر

تایپ و نەخشەسازی و بەرگ: نوسەر

تیراژی: شەشسەد دانە

چاپی یەکەم دووهەزارو شەش

چاپ: چاپخانەی کارۆ

ژمارەی سپاردنی(٧٢٥)ی وەزارەتی رۆشنبیری دراوەتیَ





بۆ...

**ڤالاّ** رۆژێك دێت و لەدڵما هێلانە چێدەكات

بۆ... رەیان و راسان

*ئەووێنانەی لەم كتێبەدا هەیە دەكرێ
منالّ خۆی رەنگی كات

## مناڵەكان

پەپولە خۆش خەیاڵەكان.
پێكەنینتان
وەكو شەپۆلی دەریایە.
توڕەبونتان: رەشەبایە.
هیوای ئێوە وەك هەڵگوردە
لەبن نایا،
جڵەو ناكرێ
وەكو ئەسپی سەركەش وایە.









# جانتا

ئەم جانتایەی ناو دەستم،
جێی ئومێدەو مەبەستم.
جار، جار ئەیکەمە شانم،
منیش بەوەوە جوانم.
پڕ دەفتەرو، کتێبە ئەو،
ئاگام لێیە بەڕۆژو شەو.
جانتاکەم زۆر خۆشەویستە،
چونکە من زۆرم پێویستە.
کەتەواو بووم لەوانە،
جێی ناهێڵم لەقوتابخانە.

## هەموو رۆژێ

هەموو ڕۆژێ ئەم دڵە،
شاد ئەکەم بەئەو گوڵە
هەڵئەمژم بۆنی خۆشی،
بۆنی هەڵاڵە پۆشـــی.
ئەم گوڵە ڕەنگ جوانە،
نەخشی بەرزی یەزدانە.
من ناهێڵم هەڵـــوەرێ،
قەت ڕەنگی زەرد هەڵگەڕێ
هەرگیز دڵی ناشکێنـــم،
خۆمی لێنا ڕەنجێنـــم.



## دایەگیان

بەو شیرەی خۆت دایەگیان،
بمخەرە کۆڕی ژیـــان.
تا لە نەخۆشی دووربـــم،
لەش ساغ، گوڵێکی سووربم.
شیری دایکم خاوێنـــە،
بۆ سۆزداری هەوێنـــە.
سەرچاوەی هۆش و نـــازە،
هەردەم ئامادەو ســـازە.
دایە تۆ مەم ڕەنجـــێنە،
بەو شیرە بم خەوێنـــە.
چونکە پاکو خاوێنە،
بێوێنەیە، بێوێنە.





## شیری دایکم



شیری دایکم پـــیرۆزە،
پڕخۆشەویستی و سۆزە.
شیری پاکو سروشتـــــی،
دوور لەخەم و مەترسی.
پڕلە ڤیتامینـــــاتە،
بۆدڵ مایەی نەجـــاتە.
دایە بەو شیرە پــــاکە،
پەروەردەمکە زۆر چاکە.
تەنیا هەر بەشیری خۆت،
بەسۆزو ئەوینی خـــۆت.
ئەبم بەگوڵێکی جـــوان،
بۆن خۆش بۆ باخچەی ژیان
ئەبمە تاکێکی دڵســـــۆز،
بۆئایندەی گەل و هـــۆز.



## پەپولەی ڕەنگاو ڕەنگم

پەپولەی ڕەنگاو ڕەنگم،
گەڵێ جوانو قەشەنگم
عەشقی گوڵو گوڵزارم،
بۆیە منیش بێگەردم
هاوڕێی منالی جوانم،
بێئەو تاڵە ژیانم
هەردەم لەناو باخانم
بۆیە رازاوەو جوانم



منالأن باڕوخۆشبین،
بۆ یەکتر زۆر دڵسۆزبین
هێمای ئاوەدانی بین،
بۆیەکتر بەپەرۆشبین
هیوامان هەرخوێندن بێت،
هەوڵو کۆششکردنبێ
بەڵکو بە خوێندەواری،
ڕێگامان رۆشنتربێ



## گۆرانیەك بۆ ئاشتی

وەنەوشەی کەژین، گوڵی بەهارین
کۆتری ئاشتین و لەشەڕ بێزارین.
خونچەی پشکوتوی تازە لاولاوین
نەو نەمامێکین لەم خاکە ڕواوین..
ئایندەی گەل و خاکو ولاتین،
بۆیەسەربەرزو، بەختیارو، شادین.
****************
وەرن منالأن، ئێوەش لەگەڵمان،
هەموودەستگرین،بچین بۆ سەیران.
بۆ کامەرانی و بۆشادمانی،
هەر وەك نەسیم و شنەی بەیانی.
بۆ ئاشتی بژین، بۆ بێگەردی ژین.
هەتائەتوانین نەفرەت لەشەڕ کەین.



## میکانۆ

هەندێ پارچەی رەنگاو رەنگ،
لێکیان ئەدەم بەبێ دەنگ.
هەندێکجار وەك تەیارە،
یان لەشێوەی سەیارە
نەخشەیان لێپێکدێنم،
خۆمی پێئەخلافێنم.
ئەوکاتانەی بەتەنیام،
لەگەڵ ئەوا دڵنیام.
بەسانایی و لەسەرخۆ،
دەژیم لەگەڵ میکانۆ
بۆ تەنیایی منوتۆ،
وەك هاودەمە میکانۆ..



## نەمام

منداڵین
نازدارین
پەپولەی خۆش خەیاڵین،
تریفەین
فریشتەین
گوڵزاری ئەم سروشتەین،
خوێن ئاڵین
چاو کاڵین
ڕووناکی هەموو ماڵین،
بەنازین
پڕ رازین
بۆیە بەخۆ دەنازین،
جوانین
نیانین
نەمامی باخی ژیانین.



## پشیله

لاچۆ پشەی ناشیرین
دڵ پڕ لە ئازارو قین،
تۆ دڕی،
خو شڕی،
ئاژەڵێکی بێفەڕی
حەز بەئاژاوەو شەڕی،
لاچۆ دەی،
تۆ سپڵەی،
ئاژەڵێکی دڕندەی
ئازاری منیش ئەدەی،
تۆ جوجکەکانت خواردم،
هیچیانت بۆ نەبواردم.
دەبڕۆ دەی،
لاچۆ دەی،
ئاژەڵێکی دڕندەی،
تۆ زۆر سپڵە و شەرمندەی..



## ئەلەند

ئەلەندین
پێشەنگین
وەك گوڵشەنی بەهارین،
پەپولەین
بچکۆلەین
لالەی هەردوو کۆسارین،
زیرەکین
چەلەنگین
ڕۆڵەی خاکو وڵاتین،
بەهۆشین
پڕجۆشین
لە تێکۆشان چالاکین،
زۆر ژیرین
دڵگیریـــن
خاوەنی هۆش و بیرین..





## تەلیفۆن

ئەو ئامێرەی زۆر خـــێرا،
دەنگت بۆ هەر کوێ دەبا.
کە زەنگەکـــــەی لێدرا،
وەڵام بەرەوە خـــــێرا.
ئەزانی کـــە تەلەفۆن،
کام زانا هێنایە بـــوون
گراهام بێڵـــی زانـــا،
لە گوێی بگرەو بـــیزانە.
چەند خۆشە بەتەلەفـۆن،
قسەو گفتو گــــۆکردن.
بۆ بەسەر بردنی کـــات،
خۆت لە خەم بدەنەجـات.

زەنگی تەلەفـــۆن لێدە،
کـــولـــێ دڵـــت فڕێدە.
بەسەر بەرن کـــاتی خۆش،
لەگەڵ ئەو بەدڵی خـــۆش.
چونکە تەنیا تە لیفـــۆن،
پێت دەبە خشێ ئارام بوون..



# گۆرانیەك بۆ وەرزەكان

## بەهار

بەهـــارە، بەهـــــــارە،
وەرزی گوڵ و گوڵـــــــزارە.
وادەی سەیران و گەشتە
بابـــــڕۆین بۆ ئەو دەشـــتە،
بچنـــین گوڵـــی زەردو سوور.
بڕۆین بۆ نزیك و دوور
بۆ سەر ســەوزەگیای بەهـــار،
یان بۆ كــــەناری رووبـــــار.
تـــاوێ دوور لــــەژاوەژاو،
خۆشی بدەین بـــــەهـــــەناو.



## هاوین

هاویـــــنە، هـــــاوینە،
تیشكی هــــەتاو بەتینـــــە.
زۆر خۆشـــــە شەوی هاویـــن،
ئەستێرەو ئاسمانی شـــــین.
یـــان..یاری و گەمــــەی ڕۆژان
خـــەوتنی دوای نیــــوەڕوان.
سەوزەو میوەی ئـــــەم وەرزە،
تابلـــۆیەكـــە زۆر بـــەرزە.
دوای هاوین بـــەدڵـــی زیـــز،
دەگــــەینە وەرزی پایـــیز.
وەرزی بـــارانـــی پەڵـــە،
چاوەڕێـــین بیدا پـــەڵـــە.






پاییزە، پاییزە،
سروشت مەلول و زیزە.
پاییزە وەکو جاران،
دەیهێنێ بەفر و باران.
گەڵاێ دار دەوەرێنێ،
بەرگی هەژار دەدڕێنێ.
گەردەلول و باو بۆران،
ئەیگۆڕێ ڕەنگی ئاسمان.
بۆنی خاکی دوای باران،
ئەپڕژێتە لوتی هەموان.




زستانە، زستانە،
کاتی بەفرو بارانە.
کەمکەمەیەك هەتاوە،
خۆریش گەرمی نەماوە.
بەرگی گەرم ئەپۆشین،
تادوور بین لە نەخۆشی.
تاساردو سەرمای زستان،
نەی تەزێنێ جەستەمان.
ئەوسا دوای باران بڕان،
کۆتایی هەردێ زستان.
بۆ بەهارێکی تازە،
دڵمان جێگەی زۆر ڕازە.



ئاهەنگی جەژن

چەند خۆشە جەژن و ئاهەنگ،
دنیا پڕ دەبێ لەڕەنگ
سەوزو سوور تێکەڵاوە،
ئاسمان شینەو هەتاوە.
وەك پەپولەی ڕەنگاو ڕەنگ،
دێین و دەیکەین بەئاهەنگ.
بەئاوازو گۆرانی،
بەشادی و کامەرانی.
ژین پڕ دەبێ لەئەوین،
پڕ لەگوڵی پێکەنین.

## کوردستان

کوردستان چەند شیرینە،
چەند ڕازاوە وسەنگینە.
سروشت و شاخی جوانە،
وەك بەهەشتی یەزدانە.
باخ و دەشتی ڕەنگینە،
جێگەی عەشق و ئەوینە.
دەلالە کوردستانم،
هەرئەوە نیشتمانم.
گیانم لەڕێی ئەبەخشم،
هەرئەوە خۆشەویستم.





## گوڵاڵە سوورە

بەهاران سەیران خۆشـــە،
کـــەدنیا سەوز پۆشـــە.
دەشتی ڕەنگینی بەهـــار،
لە دڵ دەردەکات ئـــازار.
هاژەی تاڤگەو ئاوی خـــوڕ،
ئەیدا پێمان هێزو گـــوڕ.
گوڵاڵە سورەی چاو ڕەش،
خۆی دەنوێنێ لەسەر کەژ.
لەم وەرزەدا کوردستـــان،
ئیلهام بەخشە بۆ ژیـــان.



## ڕۆژی منالآن

دەی، دەی خێرا منـــالآن،
وەرنـــە دەرێ لەمـــالآن.
ئەمـــڕۆ جەژنـــی خۆمانە،
ڕۆژی یـــاری و گـــەڕانە،
بادەست لەملی یەکتر کەین،
دڵی یەکتر زیز نەکەیـــن.
بەیەکەوە هەموومـــان،
جوانین بۆ باخچەی ژیـــان.
هەر بەقاقاو پێکەنـــین،
مانایەك ئەدەین بەژیـــن.

## هەرچەند منالْم



سەیرکەن هەرچەند منالْم،
ساواو بچکۆلەی مالْم.
ڕقم لە شەڕو شۆڕەو،
هەربۆئاشتی عەودالْم.
مرۆڤم گشت خۆشـــەویّ،
لیّرەبن، یاخـــود لەویّ.
تادیّتەدی ئـــاسایش،
دلْی منیش نـــاسرەویّ.
منالاْن لەهەرکـــویّ بن،
کورد، یاهەر ڕەگـــەزیّ بن.
هەموویانم خــــۆشەویّ،
بیّ جیاوازی تۆ یـــا من.
با... ئاشتبین گشت پیّکەوە،
هەولْ دەین بـــۆ پیّشەوە.
چونکـــە تەنیا بەئاشتی،
ژیـــان دەڕازیّتەوە.



## لیّبوردن

دوور لەشەڕو خویّن ڕشتن،
بەخـــەندەو بەلیّبوردن.
ڕیشـــەی ڕق و زۆرداری،
بەیەکجـــاری دیّ لەبن.
تۆوی ئاشتـــی بچیّنن،
بومی شەڕ هـــەلْ فڕیّنن.
هاوار بکەن بەیەك دەنگ،
شەڕخـــوازان بتاریّنن.
بـــاهیوا بژیّتەوە،
شـــەڕوشـــۆڕ ببڕیّتەوە.
تەنیا بەئـاشتی و ئەوین،
منالْ دەحـــەسیّتەوە.

## سروشتی کوردستان

سروشتی جوانی کوردستان،
پڕ پەپولەو گوڵی جوان.
سەرچاوەی ئاوەکانی
یان دیمەنی بەیانی
هەموویان دڵفرێنن
هەست و هۆش ئەبزوێنن
شاخ و دەشت و کەژو کێو،
سەیرانگای دۆڵ و نشێو.
بێوێنەیە لەجیهان
وەرزی بەهاری کوێستان.



## گوڵ بچێنن

گوڵ بچێنن تابۆنی خۆش،
بیجوڵێنێ هەست و هۆش.
تـــــاژیانـــــی رازاوە،
چوو گوڵێکـــــی گەشـــاوە.
خۆی بنوێنێ بەرەو پێش،
بۆ ژینێکـــــی پڕ ئەندێش.
باخاڵـــــی بین لــــەدرۆ،
دڵ پڕکەین لــــەڕەنگ و بۆ.
لەبەر دەرگای هـــــەرماڵێ،
لــــەتێپەڕی هـــــەرساڵێ.
گوڵێکـــی گـــــەش بروێنن
چقڵـــــی شـــــەڕ بفەوتێنن.





## قوتابخانە

چەن خۆشە لەقوتابخانە
دانیشـــــــتن کاتی وانە.
گویَ گرتن لەمامۆســـتا،
ئارام و بیَدەنگ تیَکـــڕا.
ئەوی مامۆستا دەیلَـــیَ،
تۆش لەدوایەوە بیلَـــیَ.
ئەوکـاتەی زەنگ لیَدەدریَ،
ئیَمـــەش دەچیینەدەریَ.
دەیکـــەینە یاری و وازی
هــــەمووما‌ن بیَ جیاوازی





## کۆمپیوتەر

منالاَن لیَم بڕوانن،
لەم ئامیَرە ئەزانن.
بەمە ئەلَیَن کۆمپیوتەر،
لیَی ئەنوسریَ وەك دەفتەر.
بیَئەوەی ڕەنج بکیَشیَ،
ویَنەشت بۆ ئەکیَشیَ.
ئەم ئامیَرە زۆر ژیرە.
بەڕاویَژو تەکبیرە.
هەموو کاریَك ئەزانیَ،
هیلاك بونیش نازانیَ.

بەڵام ئەوەش بزانە،
کەدەستکردی ئینسانە.
هەرچەند ژیری زیاتر بێت،
بێ هەڵە و وریاتر بێت.
چونکە بیر ناکاتەوە،
لەئاست مرۆڤ ئەبەزێ.



## من ئەمەوێ

من ئەمەوێ کەئێمەش،
وەك منالانی جیهان.
ئاسودەو بەختەوەربین،
خۆشی بدەین بەژیان.
وەك ئەوان لێو بەخەندە،
دڵ پڕهیواو خۆزگەبین.
بۆ ئاییندەی نیشتمان،
چوون گوڵ و پەپولەبین.
من ئەمەوێ جیاوازی،
نێوان مرۆڤ نەمێنێ.
لەجیاتی گوللەو بۆمبا،
فڕۆکە گوڵ بچێنێ.



بـــتـــهـــۆڤن



تۆ سەرچاوەی سەمفۆنیای،
مانگە شەوی مۆسیقـــای.
بۆ خۆراکی دڵ و گیـــان،
تۆ خۆشترین مۆسیقـــای.
بۆ بێزاری و دڵتەنگـــی،
قەشەنگترین مۆسیقـــای.
ئەی بتهۆڤن، بتهۆڤـــن،
دڵ پڕ مۆسیقای ڕۆشـــن.
جوانترین گوڵی دنیـــای،
گوڵی دنیای مۆسیقای.
تۆدڵێکی پـــڕ ڕازی،
پیانۆیەکی پڕ جۆشی،
ناسکترین ئـــاوازی..



## شارەوانی

سوپاس بۆشارەوانی،
سەرچاوەی ئاوەدانی.
بۆو پیاوە کارگوزارە،
چەندە دڵسۆزی شارە،
لە سایەی ئەوە وڵات،
رازاوەیە هەموو کات.
مامەی ژینگە پارێزی،
تۆلای ئێمە بەڕێزی.
نایەڵی شەقامەکان،
یان گەڕەك و ماڵەکان.
پیسی لێکۆبێتەوە،
میکرۆب بڵاوبێتەوە.
زۆر سوپاس شارەوانی.
شایستەی ڕێزلێنانی..

## خۆشهاتن

خۆشهاتن، بەخێرهاتن،
ئەرکێکی زۆرتان کێشا.
دایك و باوکی خۆشەویست،
رەنجێکی زۆرتان کێشا.
تا ئێمەتان پێگەیاند،
لەخۆتان تاڵکرد ژیان.
ئێستاش مافی خۆتانە،
کەبێن بۆ قوتابخانە.
پرسیار کەن لەمناڵتان،
لەخونچە گوڵیماڵتان.
تا بەباشی بخوێنین،
لەخوێندن دانەمێنین.
سوپاس لەبۆ مامۆستا،
کە بەئەم ئەرکە هەستا.
دووبارە بەخێر هاتن،
کە بۆلای ئێمە هاتن.

## میوان



تەق، تەق، تەق دەرگایە،
یاخوا بەخێربێی میوان
لەگەڵ خۆت خۆشیت هێنا،
بەخێرهاتی سەرچاومان.
میوانێکی ئازیزی،
تۆلای ئێمە بەرێزی.
فەرموو وەرە دانیشە،
ئەی سەرچاوەی بەختیاری،
تۆمایەی خەندەو شادی،
بۆلاچونی بێزاری.
بابەکۆمەڵ هەموومان،
تامی خەندە بچێژین.
باتەنیایی وەلانێین،
خەموو خەفەت بنێژین.
یاخوا بەخێربێی میوان،
خۆشیت هێنا بۆ ژینمان.

## قژ زەرد



ئەها چەند جوان وەستاوە،
ئەم قژە زەردوخاوە.
ئەڵێی: پرچی پاییزەو،
شانەی (با) دای هێناوە.
زەردە، وەك ئاڵتون زەردە،
هەردەم پاكو بێگەردە.
ڕۆژی چەند جارێك ئەیشۆم،
بۆیە واخاوو زەردە.
تۆش بڕۆ بەر ئاوێنە،
وەك من قژت دابێنە.
تاجوانبی وەك فریشتە،
بێوێنەبی، بێوێنە.



## مۆم



من ئەمەوێ وەکو مۆم،
ڕۆشنی کەم دەوری خۆم.
سود بەخەڵك بگەیەنم،
نەزانی لەبن بێنم.
ڕوناكبم، پرشنگداربم،
هاوڕێی منالی وشیاربم.
یارمەتی بەم بۆ زانست،
بۆ دڵسۆزی پاك ڕەوشت.
تابۆ خەڵكی بسوتێم،
وەك خۆری بەیان هەڵبێم..

## ماف

وەك چۆن ئێوە مافتان هەیە،
منی منداڵیش مافم هەیە.
من سەربەستم بۆ كوێ بچم
چەندە بخۆم یان چۆن بژیم.
ئازادم چۆن خۆم بگۆڕم،
كەی بمەوێ دڵ بگۆڕم
مافی خۆمە پرسیار بكەم،
بێئەوەی كەس بێزاربكەم.
مافی خۆمە چۆنها بژیم،
من ئازاد و سەربەست ئەژیم.
بۆ هەر كوێ بڕۆم ئازادم،
چونكە بەئازادی شادم.





## ساڵێكی تر

وا هاتەوە سەری ســاڵ
خۆشە بۆ ئێمەی منــاڵ.
كەبەرگی جوان بپۆشین،
تابزانین دڵخۆشـــــین
ئەم ساڵیش مامە پــیرە،
*هاوڕێیەكی دڵگــــــیرە.*
سەردانی ماڵان ئەكــات،
منداڵان خەڵات ئەكـــات.
چاوەڕێین هــەتا ئەودێ،
خۆری ساڵی نوێ هەڵدێ.

## تەسریحە

کەقـــــــــژم دائەهێنم
تەســـــــریحەیەك ئەهێنم.
ئەیدەم لەقژی خــــــاوم
تانەیەتە سەرچـــــــاوم.
بەتەسریحەی ڕەنگاو ڕەنگ،
دەبمە بوکێکـــــی قەشەنگ.
چون پروشەی بــــەفر جـــوان،
خوێن گــــــەرم لەبەر دڵان.
وەك پەری بێ هێند جوان بێ
قسەی خۆش و ڕەوان بــــێ.



## خۆگۆڕین

بەرگی جوانم کــــڕیوە،
سەیر کەن خــۆم گۆڕیوە.
وەك بەهار شۆخ و شەنگم،
زۆر دەلال و قەشەنگم.
ئەمڕۆ ئەچم بۆ سەیـــران،
ئەڕۆم بۆ گەشت و گـەڕان.
هاوڕێ لەگەڵ منــــاڵان،
بۆدەشت و بۆسەر یـــاڵان.

## ژیان

چەند جوانە ئەم ژیانە.
گەر یەکترمان خۆشبویَ.
هاوڕێی دڵسۆزی یەکبین،
بەختیاری یەکمان بویَ.
چەن خۆشەبیَ هەمووومان،
بێگەرد بین وەکو بەفر،
دژی ئاژاوەو شەڕبین،
پاکبین، پاك وەکو بەفر.

## تەرزە

سەیرکەن چۆن دەباریَ،
بەپرتاو دێتە خواریَ.
نەبارانەو نەبەفرە،
ئەویش هەرکوڕی هەورە.
وەکو گەڕی ڕەشبەڵەك،
پێدەنێتە سەرزەوی.
هەتا خۆش ئەکاتەوە،
تۆش وەکو ئەو ناسرەوی.
چەن جوانە لەپاش تەرزە،
دیمەنی سەر ئەم ئەرزە.
چەشنی خاکێکی بەراو،
نیوەی زەوی و نیوەی ئاو.
هەرچەندە بشتوێتەوە،
جوانی بیرناچێتەوە.





## خەیاڵ

وەك مەلی نێو دارستـــــان،
لەگەرمیان، بەرەو کوێستان.
ئەفڕم ئەنیشمـــــــــەوە،
بۆنی گوڵ ئەچـــــنمەوە.
بە ئارەزوی دڵی خـــــۆم،
هەرکوێ بمەوێ ئـــەڕۆم.
بەئازادی ئەخـــوێنم،
خۆشی بۆدڵ ئـــەهێنم.
چونکە منیش مناڵـــم،
فریشتەی خۆش خەیاڵم.



## ئامانج

ئای کەخۆشە گەورەکان،
پاکبن وەك ئێمەی مناڵ.
ئەوانیش یەکیان بوێ،
هەر وەکو ئێمەی مناڵ.
واز لەشەڕو شۆڕ بێنن،
چیتر یەك نەڕەنجێنن.
دڵسۆزی نیشتمان بن،
گوڵی باخچەی ژیانبن.
عەشقی جوانی سروشتبن،
وەکو ئێمەی مناڵبن.



ئای کەخۆشە گەرئێوەش،
دڵتان پاك و بێگەرد بێ،
هەوڵتان بۆبەختیاری و،
ئاسودەیی بەشەربێ.
وەك ئێمە بەوەفابن،
دڵ پڕ خۆزگەو هیوابن.
چەن خۆشە گەورەو مناڵ،
هاو ئامانج بن لەژیان.
دڵ و دەرونیان بێگەرد،
ڕووگەش وەك گوڵی ژیان..



## بچکۆلەم

بچکۆلەی خوێن شیرینم،
من دەلالم سەنگینم.
من پێویستم بۆ ژیان.
بۆ ئارامی دڵو گیان.
بۆ دەروونتان ڕوناکیم،
سەرچاوەی جوانی و پاکیم.
منم فریشتە بۆ ژین،
ئەبمە هەوێن بۆ ئەوین.
تۆوی شادی ئەچێنم،
بوغزو ڕق ئەفەوتێنم.



## سرودەکانی ئاو

ئەم سروشت و ژیانە،
هەر بە ئاوەوە جوانە.
ئاو سەرچاوەی ژیانە،
پێویستی دڵ و گیانە،
با نەهێڵین ئاوی پاك،
بڕێژرێتە سەر ڕووی خاك.
تا ئاو پاك و ڕەوان بێت،
ژیان ڕازاوەو جوان بێت.
بۆ تەندروستی ئینسان،
ئاو پێویستە منالآن.
ئاو بۆ ئاوەدانیە،
ئاو سەرچاوەی جوانیە.

## بێگەردی ئاو

چەند بێگەردە ئەو ئاوە،
سروشت بە ئێمەی داوە.
زۆر زولاڵ و سازگارە،
پێویستی گوندو شارە.
بۆ خاوێنی و بۆ جوانی،
بۆباخ و ئاوەدانی.
ئاو هەوێنی ژیانە،
ژیان بێ ئاو زیندانە.
با... بەگەورەو بچوکمان،
وەك ئەرکێکی سەرشانمان.
دەست بەئاوەوە بگرین،
زۆر بەپاکی ڕایبگرین..

ئاوپیس مەکەن منالآن،
چونکە پێویستە بۆ ژیان.
هەرگیز مەیدەن بەفیڕۆ،
کاتێ کەدێتە ماڵتان.
ئاو سەرچاوەی ژیانە،
دیاری دەستی یەزدانە.
بۆیە پاك ڕاگرتنی،
ئەرکی سەرشانمانە.
باهەمووماں هەوڵدەین،
پارێزگاری لێبکەین.
پاك ڕایگرین سەرچاوەکان،
بیپارێزین کانیاوەکان.

ئاو پێویستە بۆ ژیان،
بۆسروشتێکی جوان.
سەرچاوەی جوانی و پاکی،
هێمایە بۆ ڕووناکی.
لەزنەو، چاوەو، کانی،
هەڵئەقوڵێ بەجوانی.
ئاوی ساردو سازگارە،
دیاری وەرزی بەهارە.
بۆیە پاراستنی ئاو،
پاراستنی ژیانە.



## منالەكان

باله كاروان جێنەمێنن،
باوەك ئێمە دانەمێنن.
سواری ئەسپی خۆرەتاوبن،
مەشخەڵێكی داگیرساوبن
تاریكایی سەرەو ژێركەن،
چاوی شەڕخوازانتان كوێركەن.
گرەو مەكەن لەسەر لاشەی
ئەسپی تۆپیو.!
بەگۆتەی پوچی پیاوكوژان
باوەڕمەكەن، مەخۆن فریو..



## ترێ رەشە

چەند خۆشە ترێ رەشە
وەكو چاوی خۆم گەشە
ترێ سپی و كشمیشی
ئۆف خوایە چەندە خۆشی
یان بەهاران تولەمێو
بۆ یاپراخە گەڵامێو
مێوەكەی سەر حەوشەمان
سێبەر دەكا بۆ هەمووان
هەر كاتێكیش پێگەیی
بەسەریا سەرناكەوین




سێوی زەردو لاسووره
بۆ دڵ مایەی سەبووره
یان بەهاران مزره سێو
پێی دەڵێن فەریکە سێو
چەندە بەتامن خوایە
خواردنیان دوایی نایا
من ئەوەندەم حەز لێیە
هەردەم سێوێکم پێیە
ئەها تۆز، تۆز لێی دەخۆم
حەز ئەکەن بەشتان ئەدەم

## پرتەقاڵ



پرتەقاڵ، پرتەقاڵ
خۆی شیرین و ناوکی تاڵ
مزرو خۆش و بەتامی
دەڵێی ناسکە شەمامی
حەزئەکەم هەموو شەوێ
تاچاو دەچێتە خەوێ
من پرتەقاڵێ بخۆم
ئینجا دەم و دان بشۆم
پاشان کەچوومە سەرجێ
زوو خەوم لێدەکەوێ



## هەرمێ

هەرمێی رووومەت گوڵاوی
بۆن خۆش، بەتام، پڕ ئاوی
ئەزانی زۆر ئازیزی
درەختێکی بەسۆزی
هەرکە تەواو پێگەیی
دەکەویتە سەر زەوی
منیش بەردت تێناگرم
پێ لەسەر لقت ناگرم
زۆرجار دڵم بۆت دەچێ
چونکە لەهەرمێ دەچێ



## شووتی

باوکە شوتیم بۆبێنە
چیتر دڵم مەشکێنە
تۆ قەت شوتیم بۆ ناکڕی
گوێ لە سکاڵام ذ گری
شوتی خۆی بۆ خواردنە
ناوکی بۆ برژاندنە
هەرچەند خواردنی خۆ
هەڵگرتنی ناخۆشە
بەشەرتی شیرینی و جوانی
باوکە هەر تۆ ئەیزانی
کامە سوورو شیرینە
تامی خۆش وەك هەنگوینە.



## کەروێشک

کەروێشکێکی بچوکم،
گوێ قوت و ئێسك سوکم.
تووك درێژو سپی و سۆڵ
حەزئەکەم بەجموجۆڵ.
خواردنم گژو گیایە
هێلانەم لە گڵدایە
هەندێك پێم دەڵێن گێلەو
زۆریش دەڵێن وریایە
بەڵام من بێزیانم
هاوڕێی گشت منالانم.

## یاری



وەرن، وەرن هاوڕێیان
ئەی منالانی کۆلان
بابە کۆمەڵ یاری کەین
جێی یاریمان دیاری کەین
بابچینە سەر ئەو کێوە
پڕ هەورازو نشێوە
دەمێکە نەڕەخساوە
یاری کەین ئالەم ناوە
نۆرەی یاری جۆجۆیە
بەزمێکی لەسەر خۆیە
من چاوم دەنوقێنم
خۆشاردنەوەش لەتۆیە
چەند جارێك خۆ وەشێرین
چاو لەیەکتر نەبوێرین
پاشان کاتی جۆلانە

پالْ بەیەکەوە نانە
هەموو بەنۆرە پالْنێین
خەمو خەفەت لەچالْنێین
ئا ئەمەیە جۆلانێ
پێشی دەلْێن دیالانێ
دوایش نۆرەی راکردن
ماراسۆن و پێشکەوتن
هەر کەسێکیش پێشکەوێ
خەلاّتی بەردەکەوێ
ئەویش گەزۆو حەلْوایە
لەخۆشی بێ هاوتایە.



## بەتریق

منالْی بەسەلیقە
منیش ناوم بەتریقە
گیانداریێکم گەلێ جوان
دەژیم لەناوچەی کوێستان
لەباشووری گۆی زەوی
شوێنێکی ساردو نەوی
بەستەلْەك سەهۆلْ بەندان
هەر وەك مانگی رێبەندان



## بەرهەمە چاپکراوەکانی من

*پروشە شیعری منالان ١٩٩٨

*کەڤاڵی وەنەوشە شیعری منالان ٢٠٠٠

*گۆرانییەکی قژ زەرد شیعر ٢٠٠٢

*ئەو منالەی دوێنی گریا

ستونی رۆژنامەوانی ٢٠٠٤

*چرپە چرپی ئەودیو ئازادییەکانی ژن

وتار لەمەڕ پرسی ژن ٢٠٠٤

*بەهەشتێ لەکاغەز

ستونی رۆژنامەوانی ٢٠٠٥

*دڵۆپە شیعر ٢٠٠٥

*بیبلیۆگرافیای چاپکراوەکانی

چاپ و بڵاوکردنەوە. ٢٠٠٥

* بچووکبوونەوەی ئینسان بەهاری ٢٠٠٦

تێبینی: ئەم شیعرانە لەسالانی کۆتایی سەدەی بیستو سەرەتای سەدەی بیستو یەك نوسراون بەلام بلاوکردنەوەیان وەك کتێب دواکەوتووە.

